


المملكة العربية السعودية

1173

وزارة الشؤون الإسلامية والدعوة والإرشاد


# سێ بنچینەکەی بیروباوەڕ و بەڵگەکانیان




دانانی شێخی ئیسلام

پێشەوا : (محمد)ی کوڕی (عبد الوهاب)



وكالة المطبوعات والبحث العلمي

uspr@moia.gov.sa

لە چاپەمەنییەکانی وەزارەتی کاروباری ئیسلامی وئەوقاف وبانگەواز ورێنمایی

# سێ بنچینەکەی بیروباوەڕ و بەڵگەکانیان

دانانی شێخی ئیسلام

پێیشەوا : (محمد)ی کوڕی (عبد الوهاب)

وەرگێڕانی

محمد عبد الرحمن لطيف

پێداچوونەوەی

خليل أحمد　　　　پشتیوان صابر عزیز

وەکالەتی کاروباری چاپەمەنی وتوێژینەوەی زانستی لە وەزارەت سەرپەرشتی چاپکردنی کردوە

ساڵی١٤٣٩ کۆچی

بسم الله الرحمن الرحيم

## * پێشەکی وەرگێڕ :

إِنَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِيْنُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوْذُ بِاللهِ مِن شُرُوْرِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ .

وَأَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيْكَ لَهُ ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُوْلُهُ .

أَمَّا بَعْدُ ...

فَإِنَّ أَصْدَقَ الحَدِيْثِ كِتَابُ اللهِ وَخَيْرَ الهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ) وَشَرَّ الأُمُوْرِ مُحْدَثَاتُهَا وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ وَكُلَّ ضَلالَةٍ فِي النَّارِ .

**خوێنەری بەڕێز : ناوەڕۆکی ئەم کتێبە بریتی‌یە لە هەندێک زانیاری سەرەتایی زۆر گرنگ سەبارەت بە (بیروباوەڕی ڕاستی ئیسلام : بیروباوەڕی ئەهلی سوننە و جەماعە) کە بە بەڵگەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز و فەرموودە صەحیحەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پشتڕاستکراونەتەوە .**

**وە لە بەر ئەوەی یەکەمین کتێبە لای زانایان و فێرخوازانی زانستی شەرعی کە بە دەرس دەوترێتەوە و دەخوێنرێت لە**

بورای بیروباوەڕدا : بە پێویستم زانی وەریبگێڕمە سەر زمانی کوردی بۆ ئەوەی ببێت بە دەروازەیەك بۆ ئەو کەسانەی کە دەیانەوێت ئاشنابن بە بابەتەکانی بیروباوەڕی ڕەسەنی ئیسلامەتی کە بە هۆی لادان و چەواشەکاری و لاسایی کردنەوەی کوێرانە و بێئاگایی زۆرێك لە خەڵك غەریب و نامۆ بووە لە نێو کۆمەڵگای موسڵمانانددا بە گشتی !

وە گرنگی و بایەخی ئەم کتێبە لەوەدا خۆیدەبینێتەوە کەوا خوێنەر فێری وەڵامدانەوەی ئەو سێ پرسیارە دەکات کەوا لە هەموو مرۆڤێك دەکرێت لە پاش مردنی و ناشتنی لە نێو گۆڕدا :

مَنْ رَبُّكَ ؟ وما دِيْنُكَ ؟ ومَنْ نَبِيُّكَ ؟

واتە : کێ خواتە ؟ ئاینت چیـیە ؟ کێ پێغەمبەرتە ؟.

بسم الله الرحمن الرحيم

* اعلَمْ رَحِمَكَ اللهُ أَنَّهُ يَجِبُ علينَا تَعَلُّمُ أربعِ مسائلَ :

واتـه : بزانـه ڕەحمـەتی خـوات لێبێـت کـەوا پێویسـتە لەسەرمان فێری چوار مەسەلە ببین :

**الأُولَى : العِلْمُ : وهوَ مَعْرِفَةُ اللهِ ، ومَعْرِفَةُ نبيِّهِ (ﷺ) ، ومَعْرِفَةُ دينِ الإسلامِ بالأَدِلَّةِ .**

**یەکەم** : زانست کە بریتی‌یە لە : ناسینی خوا و ناسینی پێغەمبەرەکەی (مُحَمَّد ﷺ) و شارەزابوون لە ئاینی ئیسلام بە بەڵگەوە .

**الثَّانيةُ : العَمَلُ بهِ .**

**دووەم** : کردەوە پێکردنی .

**الثَّالثةُ : الدَّعْوَةُ إليهِ .**

**سێیەم** : بانگەواز کردن بۆی .

**الرَّابِعَةُ : الصَّبْـرُ علَى الأَذَى فيهِ .**

**چوارەم** : ئارامگرتن لە سەر ئەزێتەکان لە پێناویدا .

والدليلُ قولُه تعالَى : ﴿وَٱلۡعَصۡرِ ١ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ ٢ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ ٣﴾ .

بەڵگەش لە سەر ئەمە خـوای گـەورە فەرموویـەتی : بـە نـاوی خـوای میهرەبـان و بـە بـەزەیی : (سـوێند بـە کـات ، بەڕاستی هەموو مرۆڤەکان لـە زەرەردان ئـیللا ئەوانـە نـەبێت کــە باوەڕیــان هێنــاوە و کــردەوەی چــاکەیان کــردووە و ئامۆژگارییان بە حەق و ئارامـگرتن کردووە) .

قالَ الشافعيُّ رَحِمَهُ اللهُ تعالَى : لوْ مَا أَنْزَلَ اللهُ حُجَّةً عَلَى خَلْقِهِ إلاَّ هذِهِ السُّورَةَ لَكَفَتْهُمْ .

شافعی ڕەحمەتی خوای گەورەی لێبێت فەرموویەتی :

ئەگەر خوای گەورە هـیچ بەڵگەیـەکی دانەبەزاندایـەت بـۆ سەر دروستکراوەکانی تەنها ئەم سورەتە نـەبێت ئـەوا بـەس بوو بۆیان .

وقال البُخَارِيُّ رحِمَهُ اللهُ تعالَى : بابٌ العلمُ قبلَ القَولِ وَالعَمْلِ.

والدليلُ قَولُه تعــالَى : ﴿ فَٱعْلَمْ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱسْتَغْفِرْ لِذَنۢبِكَ ﴿١٩﴾ ﴾ [سورة محمد] ، فبدأَ بالعلمِ قبلَ القولِ والعملِ .

بوخاری ڕەحمەتی خوای گەورەی لێبێت فەرموویەتی : بابـەتێك : (زانسـت لـە پـێش گوفتـار و کردارەوەیـە) ، بەڵگەش لە سەر ئەمـە خـوای گـەورە فەرموویـەتی : ﴿بزانـە کەوا هیچ پەرستراوێك نیيە شایستەی پەرستن بێت تەنها ٱللَّهُ نـەبێت ، وە داوای لێخۆشـبوون بکـە بـۆ تاوانـەکانت﴾ ، بـە زانست دەستی پێکرد پێش گوفتار و کردار .

* اعلَمْ رَحِمَكَ اللهُ : أَنَّهُ يَجِبُ على كُلِّ مُسْلِمٍ ومُسْلِمَةٍ تَعَلُّمُ هذه الــمسائلَ الثلاث وَالعَمْلُ بِهنَّ :

بزانـە ڕەحمـەتی خـوات لێبێـت کـەوا پێویسـتە لەسـەر هەموو موسڵمانێکی پیاو و ئافرەت فێری ئەم سێ مەسـەلەیە ببێت و کردەوەشیان پێبکات :

الأُولَى : أنَّ اللهَ خَلَقَنا ورَزَقَنا ولَمْ يَتْرُكْنا هَمَلاً بَلْ أَرْسَلَ إلينا رَسُولاً فَمَنْ أَطَاعَهُ دَخَلَ الــجنَّةَ وَمَنْ عَصاهُ دَخَلَ النَّارَ .

یەکەم : بەڕاستی خوا ئێمەی دروست کردووە و ڕزقی داوین و وازی لێنەهێناوین و بەرەڵای نەکردوین بەڵکو پێغەمبەرێکی بۆ ناردووین جا هەر کەسێك گوێڕایەڵی ئەو پێغەمبەرە بکات ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە و هەر کەسێکیش سەرپێچیی بکات ئەوا دەچێتە ئاگری دۆزەخەوە .

وَالدَّليلُ قولُهُ تعالى : ﴿إِنَّآ أَرْسَلْنَآ إِلَيْكُمْ رَسُولًا شَٰهِدًا عَلَيْكُمْ كَمَآ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ رَسُولًا ﴿١٥﴾ فَعَصَىٰ فِرْعَوْنُ ٱلرَّسُولَ فَأَخَذْنَٰهُ أَخْذًا وَبِيلًا ﴿١٦﴾﴾ [المزمل].

بەڵگەش لە سەر ئەمە خوای گەورە فەرموویەتی : بەڕاستی ئێمە پێغەمبەرێکمان بۆ ناردوون شایەتە بەسەرتانەوە هەروەکو چۆن پێغەمبەرێکمان نارد بۆ لای فیرعەون ﴿١٥﴾ جا فیرعەون سەرپێچی ئەو پێغەمبەرەی کرد و ئێمەش بە توندترین شێوە لە ناومان برد .

الثَّانيةُ : أنَّ اللهَ لا يَرْضَى أنْ يُشْرَكَ معهُ أحدٌ في عبادتِه لا مَلَكٌ مُقَرَّب ولا نَبِيٌّ مُرْسَل .

دووەم : بەڕاستی خوای گەورە ڕازی نابێت هیچ کەسێك بکرێت بە شەریکی لە پەرستنیدا نە فریشتەیەکی نزیك لە خۆی و نە هەواڵپێدراوێکی نێردراو (پێغەمبەر)یش .

والدليلُ قولُهُ تعالى : ﴿ وَأَنَّ ٱلْمَسَٰجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُواْ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدًا ۝١٨ ﴾ [الجن].

بەڵگەش لە سەر ئەمە خوای گەورە فەرموویەتی : بەڕاستی مزگەوتەکان (شوێنەکانی سوجدە بردن) تەنها بۆ خوان (مەبەست ئەوەیە بۆ خوا پەرستن بە تەنها دروست کراون) کەواتە ئێوەش لەگەڵ خوادا هیچ کەسێکی تر مەپەرستن و هاواری تێمەکەن .

الثَّالثةُ : أنَّ مَنْ أَطاعَ الرسولَ ووَحَّدَ اللهَ لا يَجوزُ لهُ مُوالاةُ مَنْ حَادَّ اللهَ ورَسولَهُ ولَو كانَ أقْرَبَ قَرِيبٍ .

سێیەم : بەڕاستی هەر کەسێك گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ بکات و خوای گەورەش بە تەنها بپەرستێت ئەوا دروست نییە بۆی دۆستایەتی هەبێت بۆ کەسانێك کە لە ڕێی خوا و

پێغەمبەرەکەی لایان داوە و بێباوەڕن ئەگەر چی نزیکترین کەسیشی بێت .

والدليلُ قوله تعالى : ﴿لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْأَخِرِ يُوَآدُّونَ مَنْ حَآدَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَوْ كَانُوٓاْ ءَابَآءَهُمْ أَوْ أَبْنَآءَهُمْ أَوْ إِخْوَٰنَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ كَتَبَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْإِيمَٰنَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّنْهُ ۖ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ رَضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُواْ عَنْهُ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ حِزْبُ ٱللَّهِ ۚ أَلَآ إِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٢٢﴾﴾ [المجادلة] .

بەڵگەش لە سەر ئەمە خوای گەورە فەرموویەتی : خەڵکانێك نابینیت باوەڕیان بە خوا و ڕۆژی دوایی ببێت و دۆستایەتیشیان هەبێت بۆ کەسانێك کە لە ڕێی خوا و پێغەمبەرەکەی لایان داوە و بێباوەڕن ئەگەر چی ئەوانە باوکیان بن یان کوڕیان بن یان برایان بن یان لە عەشیرەتیان بن ئا ئەوانە خوا ئیمانی جێگیر کردووە لە ناو دڵەکانیان و پشتگیریان دەکات بە توانایەك لە لایەن خۆیەوە و دەیانخاتە ناو باخانێکەوە لە بەهەشتدا کە ڕوباریان بە ژێردا

تێدەپەڕێت و بە هەتاهەتایی تێدا دەمێننەوە ، ئەوانە خـوای گەورە لێیان ڕازی بووە و ئەوانیش لەو ڕازی بوون ، ئا ئەوانە حزبی خوان ، بە بەڕاستی حزبی خوا ڕزگاربوون .

* اعلَمْ أَرْشَدَكَ اللهُ لِطاعَتِهِ أنَّ الحَنِيفِيَّةَ مِلَّةَ إبراهيمَ : أنْ تَعْبُدَ اللهَ وَحْدَهُ مُخْلِصًا لَـــهُ الدِّين، وبِذلِكَ أَمَرَ اللهُ جَميعَ النَّاسِ وخلَقَهُـــمْ لَـــها، كما قال تعالى: ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ۝٥٦﴾ [الذاريات] ، وَمَعَنى (يَعْبُدُونِ) يُوحِّدون .

بزانە خوای گەروە ڕێنماییت بکات بـۆ گوێڕایـەڵی کردنـی کە بەڕاستی ڕاساڵێتی ئاین و ڕێبازی پێغەمبەر ئیبراهیم (عليه السلام) بریتیـیە لـەوەی کـە : خـوا بپەرستیت بـە تـەنها و دینداری بە دڵسۆزی و پاکی تەنها بۆ ئەو ئەنجامبـدەیت ، وە بەمـەش خـوا فـەرمانی کـردووە بـە هـەموو خـەڵك و بـۆ ئـەم مەبەسـتەش دروسـتی کـردوون ، هــەر وەك خــوای گــەورە فەرموویەتی : من جنۆکە و مرۆڤم دروست نەکردووە تەنها بۆ پەرستنی خۆم نەبێت ، (يَعْبُدُونِ : بم پەرستن) واتا بـە تـەنها من بپەرستن .

وَأَعْظَمُ ما أَمرَ اللهُ به التَّوحيدَ وهو : إِفْرادُ اللهِ بالعِبادَة ، وَأَعْظَمُ ما نَهَى عنه الشِّرْكُ وهو : دَعوةُ غَيرِهِ مَعَهُ .

وە گەورەترین شت خوا فەرمانی پێکردبێت یەکخواپەرستییە کە بریتییە لە : یەکتا کردنەوەی خوا بە پەرستن ، وە گەورەترین شت خوا قەدەغە و ڕێگری لێ کردبێت شەریك بڕیاردانە بۆ خوا کە بریتییە لە : پەرستنی جگە لە خوا لەگەڵ خوادا .

والدليل قوله تعالى : ﴿وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ ٣٦﴾ [النساء] .

بەڵگەش لە سەر ئەمە خوای گەورە فەرموویەتی : خوا بپەرستن بە تەنها و هیچ شتێك مەکەن بە شەریکی .

* فَإِذَا قِيلَ لَكَ : مَا الأُصُولُ الثَّلاثَةُ التي يَجِبُ على الإنسانِ مَعرِفَتُها ؟

جا ئەگەر پێت وترا : ئەو سێ بنچینەیە کامانەن کە پێویستە لەسەر مرۆڤ بیانزانێت ؟

فقُلْ : مَعْرِفَةُ العَبْدِ رَبَّهُ ، ودينَهُ ، ونبيَّهُ محمداً (ﷺ) .

تۆش بڵێ : ئەو سێ بنچینەیە بریتین لەوەی کە :

بەندە پەروەردگاری خۆی و ئاینەکەی و پێغەمبەرەکەی (مُحَمَّد ﷺ) بناسێت .

## الأصل الأول : معرِفةُ العبدِ رَبَّهُ

## بنچينەی يەكەم : بەندە پەروەردگاری خۆی بناسێت

فإذا قيلَ لكَ : مَنْ رَبُّكَ ؟

ئەگەر پێت وترا : كێ پەروەردگارتە ؟

فَقُلْ : رَبِيَّ اللهُ الذي ربَّانِي ورَبَّى جميعَ العالمينَ بِنِعَمِهِ ، وهو مَعْبودِي لَيسَ لِي مَعبودٌ سِواهُ .

تۆش بڵێ : پەروەردگاری من خوایە (ٱللَّهُ) كە پەروەردەی كردووم و پێیگەیاندووم و هەموو جیهانیان (بەدیهێنراوەكان)یشی پەروەردە كردووە بە نیعمەتەكانی ، وە تەنها ئەو پەرستراومە و هیچ پەرستراوێكی ترم نییە جگە لە ئەو .

والدليلُ قوله تعالى : ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ .

بەڵگەش لە سەر ئەمە خوای گەورە فەرموویەتی : سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی كە پەروەردگاری هەموو جیهانیانە .

وكُلُّ ما سِوَى اللهِ عالَمٌ ، وأنا واحِدٌ من ذلكَ العالَمِ .

وه هـــه‌موو شـــتێك جگـــه لـــه خـــوا (ٱللَّهُ) جیهانـــه (دروســـتکراوه) ، وه منـــیش یـــه‌کێکم لـــه‌و جیهانـــه (دروستکراوانه) .

فإِذَا قيلَ لكَ : بِـــمَ عرفْتَ ربَّك ؟

ئه‌گـــه‌ر پێـــت وتـــرا : بـــه چـــی په‌روه‌ردگاره‌کـــه‌تت ناسیوه‌ته‌وه ؟

فقُلْ : بآياتِهِ ومَخلوقاتِهِ ، ومِنْ آياتِه : اللَّيلُ والنَّهارُ والشَّمْسُ والقَمَرُ ، ومِنْ مَخلوقاتِهِ : السَّمواتُ السَّبْعُ والأَرَضُونَ السَّبْعُ ومَنْ فِيهنَّ وما بينهما .

تۆش بڵـێ : به نیشانه‌کانی و دروسـتکراوه‌کانی ، وه لـه نیشـــانه‌کانی* : شـــه‌و و ڕۆژ و خـــۆر و مـــانگ ، وه لـــه دروستکراوه‌کانی : حه‌وت ئاسمانه‌کـه و حـه‌وت زه‌وییـه‌که و ئه‌وانه‌ی که تێیاندا هه‌ن و ئه‌وانه‌ش که له نێوانیاندا هه‌ن .

---

* واته ئه‌وانه نیشانه‌ی پـه‌روه‌ردگارێتی و زانایـه‌تی و دانایـه‌تی و بـه بـه‌زه‌یـه‌تی و گه‌وره‌یی توانا و ده‌سه‌ڵاتی خوای به‌دیهێنه‌ر و خاوه‌ن و به‌ڕێوه‌به‌ری بوونه‌وه‌ره، هه‌موو ئه‌مانه‌ش ئه‌وه ده‌سه‌لمێنن که‌وا ته‌نها خوا شایسته‌ی په‌رستنه و ده‌بێت ئێمه یه‌کخواپه‌رست بین .

والدليلُ قولُـــه تعالــى : ﴿وَمِنْ ءَايَـٰتِهِ ٱلَّيۡلُ وَٱلنَّهَارُ وَٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُۚ لَا تَسۡجُدُواْ لِلشَّمۡسِ وَلَا لِلۡقَمَرِ وَٱسۡجُدُواْ لِلَّهِ ٱلَّذِي خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمۡ إِيَّاهُ تَعۡبُدُونَ ٣٧﴾ [فصلت] .

بەڵگەش لە سەر ئەمە خـوای گـەورە فەرموویـەتی : لـە نیشانەکانی پـەروەردگارێتی خوای گەورە شەو و ڕۆژ و خۆر و مـانگ ، سـوجدە مەبـەن نـە بـۆ خـۆر و نـە بـۆ مـانگ بـەڵکو سوجدە بۆ خوای تەنها شایستەی پەرستن ببەن کە ئەوانـەی دروست کردووە ئەگەر ئێوە دەتانەوێت تەنها ئەو بپەرستن .

وقولُهُ تعالى : ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ يُغۡشِي ٱلَّيۡلَ ٱلنَّهَارَ يَطۡلُبُهُۥ حَثِيثٗا وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتِۭ بِأَمۡرِهِۦٓۗ أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٥٤﴾ [الأعراف].

وە خـوای گـەورە فـەرمـوویـەتـی : بەڕاسـتی پـەروەردگاری ئێوە خوا (ٱللَّهُ)یە کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە لە شەش ڕۆژدا پاشان بەرز بووەتەوە بە سەر عەرشدا ، بە شەو

ڕۆژ دادەپۆشێت و بە ڕۆژیش شەو دادەپۆشێت زۆر بە پەلە بە دوای یەکتردا دێن ، وە خۆر و مانگ و ئەستێرەکان ڕاگیرکراون بە فەرمانی خوا ، ئاگادار بن دروست کردن و بڕیاردان تەنها بۆ خوایە ، گەورەیی بۆ خوای کار پڕ بەرەکەتی پەروەردگاری هەموو جیهانیان .

والرَّبُّ هو المعبودُ .

وە پەروەردگار پەرستراوە .

والدليلُ قولُه تعالى : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُمۡ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿٢١﴾ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فِرَٰشٗا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءٗ وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَخۡرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزۡقٗا لَّكُمۡۖ فَلَا تَجۡعَلُواْ لِلَّهِ أَندَادٗا وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾ [البقرة] .

بەڵگەش لە سەر ئەمە خوای گەورە فەرموویەتی : ئەی خەڵکینە پەروەردگارەکەتان بپەرستن کە ئێوە و ئەوانەی پێش ئێوەشی دروست کردووە بۆ ئەوەی لێی بترسن - بە ئەنجامدانی کردارە چاکە فەرمان پێکراوەکان و خۆپاراستن لە کردارە خراپە قەدەغەکراوەکان - ﴿٢١﴾ ئەو پەروەردگارەی

كە زەوی ڕاخستوە و ئاسمانی بینا کردووە بۆتان و لە ئاسمانەوە ئاوی بۆ هێناونەتە خوارەوە پاشان بەو ئاوە بەروبوومی بۆ دەرهێناون بۆ ئەوەی ببێت بە ڕزقی ئێوە ، کەواتە هاوشێواز و شەریك بۆ خوا دامەنێن لە پەرستندا چونکە ئێوە دەزانن خوا هاوشێواز و شەریکی نیيە و تەنها ئەوە بەدیهێنەر و ڕۆزیدەر و بەڕێوەبەری هەموو دروستکراوەکان .

قالَ ابنُ كثيرٍ رحِمَهُ اللهُ تعالى : الخَالِقُ لِهذهِ الأَشياءِ هُو المستحقُّ للعِبَادَةِ .

(ابنُ كثير) ڕەحمەتی خوای گەورەی لێبێت فەرموویەتی : دروستکار و بەدیهێنەری ئەم شتانە تەنها ئەو شایستەی پەرستنە .

* وأنواعُ العِبادَةِ التي أَمَرَ اللهُ بها مثلُ : الإسلامِ ، والإيمانِ ، والإحسانِ ، ومنهُ الدُّعاءُ ، والخَوفُ ، والرَّجاءُ ، والتَّوكلُ ، والرَّغْبَةُ ، والرَّهْبَةُ ، والخُشُوعُ ، والخَشْيَةُ ، والإنابَةُ ، والاستعانَةُ ، والاستعاذَةُ ، والاستغاثَةُ ، والذَّبْحُ ، والنَّذرُ ، وغيرُ ذلك من العبادةِ التي أَمرَ اللهُ بها كُلُّها للهِ تعالى .

وە جۆرەکانی پەرستن کە خوا فەرمانی پێکردوون وەکو :

(الإسلام) : موسڵمان بوون و ملکەچی نواندن بۆ خوای پەروەردگار .

(الإيمان) : باوەڕهێنان بە هەموو پایەکانی باوەڕ .

(الإحسان) : چاکەکاری و گەیشتن بە پلەی هەست کردن بە بینینی خوا یان بینینی خوا بۆ تۆ .

وە لەوانە :

(الدُّعاء) : پاڕانەوە و نزا و هاوار کردن .

(الخَوف) : ترس کە بریتی‌یە لە : کاردانەوەیەك ڕودەدات بە پێشبینی کردنی شتێك کەوا تیاچوون یان زیان لێکەوتنەوە یان ئەزێت پێگەیشتنی تێدا هەبێت .

(الرَّجاء) : هیوا و ئومێد پێبوون .

(التَّوكل) : پشت پێبەستن .

(الرَّغبة) : حەزکردن بە گەیشتن بەو شتەی کە حەزی لێدەکەیت و خۆشت دەوێت .

(الرَّهبة) : ترس ، بەڵام ترسانێك كە ڕاكردن و دوور كەوتنەوە لەو شتەی كە لێی دەترسی لێبكەوێتەوە ، كەواتە بریتیيە لە ترس لەگەڵ كردەوەدا .

(الـخشوع) : مل دانەواندن و كزی و لاوازی دەربڕین .

(الـخَشية) : ترس ، بەڵام ترسانێك كە بنیات نرابێت لە سەر دڵنیا بوون لە گەورەیی و تەواوێتی دەسەڵاتی ئەو كەسەی كە لێی دەترسیت بە سەرتەوە .

(الإنابَة) : گەڕانەوە و پەشیمان بوونەوە و تەوبە كردن.

(الاستعانَة) : داوای یارمەتی كردن .

(الاستعاذَة) : پەنا پێ گرتن .

(الاستغاثة) : داوای فریاكەوتن و هانا بۆ لا بردن لە كاتی تەنگانەدا .

(الذَّبْح) : سەربڕین .

(النَّذر) : شت لەسەر خۆ پێویست كردن .

وە جگە لەمانەش لە جۆرەکانی تری پەرستن کە خوا فەرمانی پێ کردوون دەبێت هەموویان تەنها بۆ خوای گەورە ئەنجام بدرێن .

والدليلُ قوله تعالى : ﴿وَأَنَّ ٱلْمَسَـٰجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُوا۟ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدًا ﴿١٨﴾﴾ [الجن] .

بەڵگەش لە سەر ئەمە خوای گەورە فەرموویەتی : بەڕاستی مزگەوتەکان (شوێنەکانی سوجدە بردن) تەنها بۆ خوان (مەبەست ئەوەیە بۆ خوا پەرستن بە تەنها دروست کراون) کەواتە ئێوەش لەگەڵ خوادا هیچ کەسێکی تر مەپەرستن و هاواری تێمەکەن .

فمَنْ صَرَفَ منها شَيْـئًا لِغَيرِ اللهِ فهو مُشرِكٌ كافِرٌ .

جا هەر کەسێك شتێك لەو پەرستنانە ئەنجام بدات بۆ جگە لە خوا ئەوا ئەو کەسە موشریك و بێباوەڕە .

والدليلُ قوله تعالى : ﴿وَمَن يَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ لَا بُرْهَـٰنَ لَهُۥ بِهِۦ فَإِنَّمَا حِسَابُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿١١٧﴾﴾ [المؤمنون] .

بەڵگەش لە سەر ئەمە خوای گەورە فەرموویەتی : هەر کەسێك لەگەڵ خوادا پەرستراوێکی تر بپەرستێت و هاواری تێبکات هیچ بەڵگەیەکیشی بە دەستەوە نییە بۆ ئەو کارەی ئەوا لێپرسینەوەی ئەو کەسە لای خوای پەروەردگاریەتی ، بەڕاستی کافر و بێباوەڕەکان ڕزگاریان نابێت و سەرفراز و سەرکەوتوو نابن .

وفي الحديثِ : «الدُّعَاءُ مُخُّ العِبَادَة»[1] .

وە لە فەرموودەدا هاتووە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : پاڕانەوە و هاوار تێکردن ناوکوڕۆك و کاکڵەی پەرستنە .

والدليلُ قوله تعالى : ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِيٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴿٦٠﴾﴾ [غافر] .

---

[1] الحديث بهذا اللفظ ضعيف ضعفهُ الإمام الألبانِي في ضعيف سنن الترمذي رقم : (٣٣٧١) ، وإنَّما صَحَّ بلفظ : ((الدُّعَاءُ هُوَ العِبَادَة)) صححهُ الإمام الألبانِي في صحيح سنن الترمذي رقم : (٢٩٦٩) .

واتە : ئەو فەرموودەیە بە لەفزی : (پاڕانەوە کاکڵەی پەرستنە) فەرموودەیەکی لاوازە ، بەڵام فەرموودەکە بە صەحیحی هاتووە بەم لەفزە (پاڕانەوە پەرستنە) .

بەڵگـەش لـە سـەر ئەمـە خـوای گـەورە فەرموویـەتی :
پـەروەردگارتان فەرموویـەتی : ئێـوە لـێم بپاڕێنـەوە منـیش وەڵامتان دەدەمەوە ، بەڕاستی ئەوانەی کە خۆیان بە گەورە دەزانن و خۆیان دەگرنەوە لە پەرستنم ئەوانـە دەچنە دۆزەخەوە بە ریسوایی و سەر شۆڕی .

ودليلُ الـخوفِ قوله تعـالى : ﴿فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧٥﴾﴾ [آل عمران].

وە بەڵگەش لە سـەر ئـەوەی کـە دەبێـت تـەنها لـە خـوا بترسیت (الـخَوف) خوای گەورە فەرموویەتی :
لە دۆستەکانی شـەیتان مەترسـن بـەڵکو لـە مـن بترسـن ئەگەر ئێوە باوەڕدارن .

ودليلُ الرَّجاءِ قوله تعالى : ﴿فَمَن كَانَ يَرْجُوا لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا ﴿١١٠﴾﴾ [الكهف].

وە بەڵگەش لە سـەر ئـەوەی کـە دەبێـت تـەنها هیـوا و ئومێدت بە خوا هەبێت (الرَّجاء) خوای گەورە فەرموویەتی :

هەر کەسێك ئومێدی هەیە بە گەیشتن بە پەروەردگاری ئەوا با کردەوەی چاکە ئەنجام بدات و لە پەرستنی پەروەردگاریدا هیچ کەسێك نەکات بە شەریکی .

ودليلُ التَّوكُّلِ قولـه تعـالى : ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ٢٣﴾ [المائدة] .

وە بەڵگەش لە سەر ئەوەی کە دەبێت تەنها پشت بە خوا ببەستیت (التَّوكل) خوای گەورە فەرموویەتی :

بە خوا پشت ببەستن ئەگەر ئێوە باوەڕدارن .

وقوله : ﴿وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسۡبُهُۥٓۚ ٣﴾ [الطلاق] .

هەر کەسێك پشت ببەستێت بە خوا ئەوا خوا بەسە بۆی.

ودليلُ الرَّغْبَةِ والرَّهْبَةِ والخُشوعِ قولُه تعالى : ﴿إِنَّهُمۡ كَانُواْ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ وَيَدۡعُونَنَا رَغَبٗا وَرَهَبٗاۖ وَكَانُواْ لَنَا خَٰشِعِينَ ٩٠﴾ [الأنبياء] .

وە بەڵگەش لە سەر ئەوەی کە دەبێت حەز لێکردن و لێترسان و مل دانەواندن و لاوازی دەربڕینت تەنها بۆ خوا

ببێت (الرَّغْبَة والرَّهبَة والـخُشوع) خوای گەورە فەرموویەتی:
بەڕاستی ئەو پێغەمبەرانەی خوا پێشبڕکێ و پەلەیان دەکرد لە کاری خێردا و خوایان دەپەرست و لێی دەپاڕانەوە بە ئارەزوو کردنی پاداشتی خوا و ترسان لە سزاکەی و خۆیان دادەنواند و ملکەچیان بۆ ئێمە دەردەبڕی .

ودليلُ الـخَشْيَةِ قوله تعالى : ﴿فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَٱخْشَوْنِي ﴿١٥٠﴾﴾ [البقرة] .

وە بەڵگەش لە سەر ئەوەی کە دەبێت تەنها لە خوا بترسیت لەگەڵ دڵنیا بوون لە گەورەیی و تەواوێتی دەسەڵاتی خوا بە سەرتەوە (الـخَشية) خوای گەورە فەرموویەتی :
لە خەڵك مەترسن بەڵکو تەنها لە من بترسن .

ودليل الإنابَةِ قوله تعالى : ﴿وَأَنِيبُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُواْ لَهُۥ ﴿٥٤﴾﴾ [الزمر] .

وە بەڵگەش لە سەر ئەوەی کە دەبێت تەنها بۆ لای خوا بگەڕێیتەوە و تەنها ڕوو لە خوا بیت بە گوێڕایەڵی کردنی و تەوبە کردن و پەشیمان بوونەوەت لە تاوانەکانت تەنها لای

خوا ببێت (الإنابَة) خوای گەورە فەرموویەتی : بگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگارتان و ملکەچ ببن بۆی .

ودليل الاستعانةِ قوله تعالى : ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ۝٥﴾ [الفاتحة] .

وە بەڵگەش لە سەر ئەوەی کە دەبێت تەنها داوای یارمەتی لە خوا بکەیت (الاستعانَة) خوای گەورە فەرموویەتی: خوایە تەنها تۆ دەپەرستین و تەنها لە تۆش داوای یارمەتی دەکەین .

وفي الحديثِ : «إذَا اسْتَعَنْتَ فَاسْتَعِنْ باللهِ»(١) .

وە لە فەرموودەدا هاتووە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ئەگەر داوای یارمەتیت کرد ئەوا تەنها داوا لە خوا بکە .

ودليل الاستعاذةِ قوله تعالى : ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ ۝١﴾ [الفلق] ، ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ۝١﴾ [الناس] .

وە بەڵگەش لە سەر ئەوەی کە دەبێت تەنها پەنا بە خوا بگریت (الاستعاذَة) خوای گەورە فەرموویەتی :

---

(١) صحيح سنن الترمذي رقم : (٢٥١٦) .

بڵـێ پەنا ئەگرم بە پەروەردگاری بەرەبەیان .

بڵـێ پەنا ئەگرم بە پەروەردگاری خەڵك .

ودليل الاستغاثـــــةِ قولـــه تعـــالى : ﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَٱسْتَجَابَ لَكُمْ ﴿٩﴾﴾ [الأنفال] .

وە بەڵگـــەش لـــە ســـەر ئـــەوەی کـــە دەبێـــت داوای فـریاکـەوتن و هانا بردنـت تەنها بۆ لای خوا ببێـت (الاستغاثة) خوای گەورە لە گێڕانەوەی حاڵی هاوەڵانی پێغەمبـەردا (ﷺ) لە کاتی (جەنگی بەدر)دا فەرموویەتی :

ئێـوە لـەو کاتـەدا داواتـان کـرد خـوای پـەروەردگارتان فریاتان کەوێت ئەویش وەڵامی دانەوە .

ودليل الذَّبْحِ قوله تعالى : ﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَالَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُۥ ۖ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿١٦٣﴾﴾ [الأنعام] .

وە بەڵگەش لە سەر ئەوەی کە دەبێت حەیوان سـەربڕین تـەنها بـۆ خـوا ئـەنجام بـدرێت (الـــذَّبْح) خـوای گـەورە فەرموویەتی :

ئەی پێغەمبەر بە خەڵکی بڵێ : بەڕاستی نوێژ کردن و حەیوان سەربڕین و ژیان و مردنم هەمووی بۆ خوای پەروەردگاری هەموو جیهانیانە ﴿١٦٢﴾ هیچ شەریکی نییە و بەمەش فەرمانم پێکراوە و من یەکەمین کەس دەبم لە موسڵمانان بۆ بەجێهێنانی فەرمانەکانی خوای گەورە .

ومِنَ السُّنَّةِ : «لَعَنَ اللهُ مَنْ ذَبَحَ لِغَيْرِ اللهِ»[1] .

وە لە فەرموودەدا هاتووە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : لەعنەتی خوا لەو کەسەی کە حەیوان سەردەبڕێت بۆ غەیری خوا .

وَدَلِيلُ النَّذْرِ قوله تعالى : ﴿يُوفُونَ بِٱلنَّذْرِ وَيَخَافُونَ يَوْمًا كَانَ شَرُّهُۥ مُسْتَطِيرًا ﴿٧﴾﴾ [الإنسان] .

وە بەڵگەش لە سەر ئەوەی کە دەبێت شت لەسەر خۆ پێویست کردن تەنها بۆ خوا ئەنجام بدرێت (النَّذْر) خوای گەورە لە وەسفی چاکەکاراندا فەرموویەتی :

---

(١) صحيح مسلم رقم : (١٩٧٨) .

ئەوانە وەفادارن بە ئەنجامدانی ئەو شتانەی کە لەسەر خۆیانی پێویست دەکەن و دەترسن لە ڕۆژێك (ڕۆژی دوایی) کەوا خراپەکانی بەربڵاوە .

## الأصلُ الثَّانـي : معرفةُ دينِ الإسلامِ بالأدلةِ

## بنچينەی دووەم : ناسينی ئاينی ئيسلام بە بەڵگەوە

وهو الاستِسلامُ للهِ بالتَّوحيدِ ، والانقيادُ لـه بِالطَّاعَةِ ، والبَرَاءَةُ مِنَ الشِّركِ وأَهْلِهِ .

ئاينی ئيسلام بريتیيە لە : ملكەچ بوون بۆ خوای گەورە بە تەنها خواپەرستی ، وە بە پابەند بوون پێيەوە بە گوێڕايەڵی كردنی ، وە دوورەپەرێزی و دابڕان و دوور كەوتنەوە لە هاوبەش دانان (شيرك) و هاوبەش بڕياردەران (موشريكەكان) .

وهُوَ ثلاثُ مَراتِبَ : الإسلامُ ، والإيمانُ ، والإحسانُ ، وكُلُّ مَرتبَةٍ لَها أَرْكانٌ .

ئاينی ئيسلام سێ پلەيە : ئيسلام (موسڵمان بوون) و ئيمان (باوەڕهێنان) و ئيحسان (چاكەكاری) ، وە هەر يەكێك لەم پلانە پايەيان هەيە .

فَأَرْكَانُ الإسلامِ خَمْسَةٌ : شَهادَةُ أنْ لا إِلهَ إلاَّ اللهُ ، وأنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ ، وإقامُ الصَّلاةِ ، وَإيتاءُ الزَّكاةِ ، وصومُ رَمَضَانَ، وحجُّ بَيتِ اللهِ الحَرامِ .

جا پایەکانی ئیسلام پێنجن :

ـ شایەتی دان بەوەی کە هیچ پەرستراوێك نییە شایستەی پەرستن بێت جگە لە خوا ، وە بەڕاستی (مُحَمَّد ﷺ) پێغەمبەری خوایە .

ـ وە ئەنجامدانی نوێژە فەرزەکان بە ڕێك وپێکی .

ـ وە زەکات دان .

ـ وە ڕۆژووگرتنی مانگی ڕەمەزان .

ـ وە ئەنجامدانی حەج لە ماڵی حورمەت گیراوی خوای گەورە .

فدليلُ الشَّهادةِ قولُهُ تعالى : ﴿ شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَأُوْلُواْ ٱلۡعِلۡمِ قَآئِمَۢا بِٱلۡقِسۡطِۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ١٨ ﴾ [آل عمران] .

بەڵگەش لە سەر شایەتومان خوای گەورە فەرموویەتی :

خوای گەورە شایەتی داوە ـ شایەتی دانێکی دادپەروەرانە ـ بەوەی کە هیچ پەرستراوێك نییە شایستەی پەرستن بێت جگە لە ئەو ، هەروەها فریشتەکان و

زانايانیش، هیچ پەرستراوێك نىیە شایستەی پەرستن بێت جگە لە ئەو ، دەسەڵاتدار و دانایە .

ومعناها : لا مَعْبُودَ بِحقٍّ إلاَّ اللهُ وحده .

واتای (لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ) بریتییە لە : هیچ پەرستراوێك نییە بە حەق شایستەی پەرستن بێت جگە لە خوا بە تەنها نەبێت.

(لَآ إِلَٰهَ) : نافيًا جميعَ مَا يُعْبدُ مِنْ دُونِ اللهِ .

(لَآ إِلَٰهَ) (هیچ پەرستراوێك نییە بە حەق شایستەی پەرستن بێت) واتە : ڕەتكردنەوە و بە ناڕەوا زانینی پەرستنی هەموو ئەو كەس و شتانەی كەوا جگە لە خوا (ٱللَّهُ) دەپەرسترێن .

(إِلَّا ٱللَّهُ) : مُثْبِتاً العِبَادةَ للهِ وَحْدَهُ لا شَريكَ لَــهُ في عبادتِهِ ، كما أنَّه لا شَريكَ لــهُ في مُلْكِهِ .

(إِلَّا ٱللَّهُ) (جگە لە خوا نەبێت) واتە : جێگیر كردن و سەلماندنی پەرستن بۆ خوا بە تەنها كە شەریك و هاوبەشی

نی‌یە لە پەرستنیدا هەروەکو چۆن شەریك و هاوبەشی نی‌یە لە موڵکیدا .

وَتَفْسِيرُها الذي يُوضِّحُها قولُه تعالى : ﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦٓ إِنَّنِى بَرَآءٌ مِّمَّا تَعْبُدُونَ ﴿٢٦﴾ إِلَّا ٱلَّذِى فَطَرَنِى فَإِنَّهُۥ سَيَهْدِينِ ﴿٢٧﴾ وَجَعَلَهَا كَلِمَةًۢ بَاقِيَةً فِى عَقِبِهِۦ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾ [الزخرف] .

وە لێکدەرەوە و ڕاڤەکاری ئەم شایەتی دانە کە ڕوونی کاتەوە بریتی‌یە لەوەی کە خوای گەورە فەرموویەتی :

لەو کاتەدا ئیبراهیم وتی بە باوکی و خزمانی و گەلەکەی: بەڕاستی من دوورەپەرێز و دابڕاو و بێباوەڕم بەوانەی کە ئێوە دەیانپەرستن تەنها ئەو خوایە نەبێت کە دروستی کردووم بەڕاستی تەنها ئەو ڕێنماییم دەکات بۆ حەق و دادپەروەری ﴿٢٧﴾ وە پێغەمبەر ئیبراهیم وتەی یەکخواپەرستی (لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ) کرد بە وەسێتنامە و هێشتیەوە لە نێو وەچە و نەوەکانیدا بۆ ئەوەی هەمیشە لە هاوبەش دانانەوە بگەڕێنەوە بۆ یەکخواپەرستی .

وقولُه تعالى : ﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَقُولُوا۟ ٱشْهَدُوا۟ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٦٤﴾﴾ [آل عمران].

**وه خـوای گـهوره فهرموویـهتی : ئـهی پێغهمبـهری خـوا بلّـێ : ئـهی ئـههلی کتێـب (گـاور و جولهکـه) وهرن بـۆ لای وتهیـهکی یهکسـان لـه نێـوانی ئێمـه و ئێـوهدا کـهوا : هـیچ کهسێك نهپهرسـتین تـهنها (ٱللَّهُ) نـهبێت ، وه بـه هـیچ شـتێك هاوبهش و شهریکی بۆ دانـهنێین ، وه هـهنـدێکمان گوێڕایـهڵی هەندێکی ترمان نهکهین له حهڵاڵ کردنی حهرامهکان و حهرام کردنی حهڵاڵهکان و بهو کاره جگه له خـوا (ٱللَّهُ) بپهرسـتین ، جـا ئهگـهر (ئـههلی کتێـب) پشـتیان کـرد لـهم بانگـهوازه و وهڵامیان نهدایهوه ئهوا پێیان بڵێن : ئێوه شایهت بن لهسهر ئهوهی کهوا بهڕاستی ئێمه موسڵمانین و ملکهچین بۆ خوا .**

ودليلُ شَهادةِ أنَّ مُحَمَّدَاً رَسُولُ اللهِ قولهُ تعالى : ﴿لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٨﴾﴾ [التوبة].

بەڵگەش لە سەر شایەتی دان بەوەی کەوا بەڕاستی (مُحَمَّد ﷺ) پێغەمبەری خوایە خوای گەورە فەرموویەتی :

بەدڵنیایی پێغەمبەرێکتان بۆ هاتووە لە خۆتان ، گرانە لەسەری ئەوەی کە ئێوە ناڕەحەت بکات ، سورە لەسەر هیدایەت دان و ڕزگارکردنتان لە ئاگری دۆزەخ ، نەرمونیانە و بە بەزەییە بەرامبەر بە باوەڕداران .

ومعنَى شَهادةِ أنَّ مُحَمَّدًا رسولُ اللهِ :

طاعتُهُ فيما أَمَرَ ، وتَصدِيقُهُ فيما أَخْبَرَ ، واجتِنابُ ما عنْهُ نَهَى وزَجَرَ ، وأنْ لا يُعْبَدَ اللهُ إلاَّ بِما شَرَعَ .

وە واتای شایەتی دان بەوەی کەوا بەڕاستی (مُحَمَّد ﷺ) پێغەمبەری خوایە بریتی‌یە لە :

- گوێڕایەڵی کردنی لەوەی کە فەرمانی پێ‌کردووە .
- وە بەڕاستخستنەوەی لەوەی کە هەواڵی پێداوە .

ـ وە دوور کەوتنـەوە لـەوەی کـە قەدەغـەی کـردووە و ڕێگری لـێکردووە .

ـ وە خوا نەپەرسترێت تـەنها بـەو شـەریعەتە نـەبێت کـە ئەو هێناوێتی .

ودليلُ الصَّلاةِ ، والزَّكاةِ ، وتفسيرُ التَّوحيدِ قولُه تعالى : ﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ ٥﴾ [البيّنة] .

بەڵگەش لە سەر نوێژ کردن و زەکات دان و لێکدانـەوە و ڕاڤەکردنی یەکخواپەرستی خوای گەورە فەرموویەتی :

فـەرمانیان پـێ نـەکراوە* تـەنها بـەوە نـەبێت کـە خـوا بپەرستن و بە دڵسۆزی و نیاز پاکی دینداری ئـەنجام بـدەن و ڕاساڵ بن و نوێژ بکەن بە ڕێـك و پێکی و زەکـات بـدەن ، ئـا ئەوە ئاینی ڕێك و ڕاستە .

* مەبەستی ئەوەیە : خوا فەرمانی بە خەڵك نەکردووە ... هتد .

ودليلُ الصِّيامِ قولُه تعالى : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ١٨٣﴾ [البقرة] .

بەڵگەش لە سەر ڕۆژوو گرتن خوای گەورە فەرموویەتی : ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ڕۆژوو گرتن فەرز کراوە لەسەرتان هەروەکو چۆن فەرز کرابوو لەسەر ئەوانەی پێش ئێوە بۆ ئەوەی لە خوا بترسن ـ بە ئەنجامدانی کردارە چاکە فەرمان پێکراوەکان و خۆپاراستن لە کردارە خراپە قەدەغەکراوەکان .

ودليلُ الحجِّ قولُه تعالى : ﴿وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلۡبَيۡتِ مَنِ ٱسۡتَطَاعَ إِلَيۡهِ سَبِيلٗاۚ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٩٧﴾ [آل عمران] .

بەڵگەش لە سەر حەج کردن خوای گەورە فەرموویەتی : مافی خوایە و فەرزی کردووە لەسەرتان کەوا حەجی ماڵەکەی بکەن ئەوانەتان کە توانای هەیە بڕوات بۆ حەج ، وە

هـەر كەسـێك كـوفر بكـات** ئـەوا بەڕاسـتی خـوای گـەورە دەوڵەمەندە و پێویستی بە جیهانیان نی‌یە .

* الـمَرتبةُ الثَّانية : الإيـمانُ وهو بِضْعٌ وسبعونَ شُـعْبَة ، فَأَعلاها قَوْلُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ ، وأدْناها إماطَةُ الأذَى عـنِ الطَّريـقِ ، والـحَياءُ شُعْبَةٌ مِنَ الإيـمانِ .

* **پلـەی دووەم** : ئیمـان و باوەڕهێنـان كـە پێكهـاتووە لـە حـەفتا و ئەوەنـدە بـەش ، بـەرزترین بەشـی بـاوەڕ وتـەی یەكخواپـەرستی‌یـە (لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ : هـیچ پەرسـتراوێك نـی‌یـە شایستەی پەرستن بێت جگـە لـە خـوا) ، وە نـزمترین بەشـی باوەڕ لادانی ئەو شتانەیە كـە ئـەزێت و ئـازاری خـەڵك دەدات لەسەر ڕێگەدا ، وە شەرم كردنیش بەشێكە لە باوەڕ .

---

** ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كەوا حـەج نـەكردن كـوفرە ، جـا ئەگـەر كەسـێك باوەڕی بە حەج كردن نەبێت ئـەوا كـافر دەبێـت و لـە ڕیـزی موسـڵمانان دەچـێتە دەرەوە ، بەڵام ئەگەر باوەڕی بە فەرزێتی حەج كردن هەبێت و توانـای ڕۆیشـتنی بۆ حەج هەبێت لەگەڵ ئەوەشـدا حـەج نـەكات لـە كەمتەرخـەمی و ڕەزیلیـدا ئـەوا موسڵمانە بەڵام كوفرێكی كردووە و تەنها زیان بە خۆی دەگەیەنێت . ـ وەرگێڕ ـ

وأركانُهُ ستَّــةٌ : أنْ تُؤمِنَ بِاللهِ ، ومَلائكَتِهِ ، وكُتُبِهِ ، ورُسُلِهِ ، واليَومِ الآخِرِ ، وبِالقَدَرِ خَيْرِهِ وشَرِّهِ .

وە **پایـەکانی بـاوەڕ شەشن** : بـاوەڕ بێنیـت بـە خـوا و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی و ڕۆژی دوایـی ، وە باوەڕت هەبێت بە قەدر خێر و شەڕی .

والدليلُ على هذه الأركانِ الستَّــةِ قولُــه تعالى : ﴿لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّۦنَ ﴿١٧٧﴾﴾ [البقرة] .

بەڵگەش لەسەر ئەم شەش پایەیەی باوەڕ خـوای گـەورە فەرموویـەتی : چـاکە بـریتی نـی‌یـە لـەوەی ڕوو لـە بـەرەی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئـاوا بکـەیت لـە کـاتی نوێـژدا ، بـەڵکو چـاکە بریتی‌یە لە چاکەی کەسێك کـە بـاوەڕی هێنابێـت بـە خـوا و ڕۆژی دوایی و فریشتەکان و قورئان و پێغەمبەران .

ودليلُ القَدَرِ قولــه تعــالى : ﴿إِنَّا كُلَّ شَىْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾﴾ [القمر] .

بەڵگەش لەسەر قەدەر خوای گەورە فەرموویەتی : ئێمە هەموو شتێكمان دروست كردووە بە قەدەر و ئەندازەیەكی دیاریكراو .

* الـــمرتبةُ الثالثةُ : الإحسانُ رُكْنٌ واحِدٌ :

*** پلەی سێیەم : چاكەكاری تەنها یەك پایەیە :**

وهو أنْ تَعْبُدَ اللهَ كَأَنَّكَ تَراهُ فإنْ لَمْ تَكُنْ تَراهُ فإنَّه يَراكَ .

ئەویش بریتی‌یە لەوەی كە خوا بپەرستیت وەكو ئەوەی كە بیبینیت ، وە ئەگەر تۆ خوا نەبینیت ئەوا ئەو تۆ دەبینێت .

والدليلُ قولُهُ تعـــالى : ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا۟ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ ﴿١٢٨﴾ ﴾ [النحل] .

بەڵگەش لەسەر ئەمە خوای گەورە فەرموویەتی : بەڕاستی خوای گەورە لەگەڵ ئەو كەسانەدایە كە خۆپارێزی دەكەن لە خراپە و ئەوانەی كە چاكەكارن .

وقولُهُ تعالى:﴿ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱلْعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٢١٧﴾ ٱلَّذِى يَرَىٰكَ حِينَ تَقُومُ ﴿٢١٨﴾ وَتَقَلُّبَكَ فِى ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٢١٩﴾ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٢٢٠﴾ ﴾[الشعراء] .

وه خوای گەورە فەرموویەتی : پشت ببەستە بە خوای بەدەسەڵات و بەبەزەیی ﴿٢١٧﴾ ئەو خوایەی كە دەتبینێت لە كاتێكدا كە بە پێوە وەستاویت لە نوێژدا ﴿٢١٨﴾ وە لە كاتێكدا كە لە ركوع و سوجدەدا دەبیت لە نێو نوێژگەراندا ﴿٢١٩﴾ بەڕاستی ئەو خوایە بیسەر و زانایە .

وقولُهُ تعالى : ﴿ وَمَا تَكُونُ فِى شَأْنٍ وَمَا تَتْلُوا۟ مِنْهُ مِن قُرْءَانٍ وَلَا تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُودًا إِذْ تُفِيضُونَ فِيهِ ۚ ﴿٦١﴾ ﴾ الآية [يونس] .

وە خوای گەورە فەرموویەتی : تۆ لە هەر حاڵەتێكدا ببیت و چەندێك لە قورئان بخوێنیت و هەر كردەوەیەك بكەیت ئیللا ئێمە شایەتین بەسەرتانەوە لە كاتێكدا كە دەچنە ناو ئەنجام دانیەوە .

والدليلُ مِنَ السُّنَّة حديثُ جبريل الــمشهور :

وه بەڵگـەش لـە سـوننەتدا فـەرمووده بەناوبانگەکـەی (جبريل)ـە :

عن عمر (رضي الله عنه) قال : بَيْنَمَا نَحْنُ جُلُوسٌ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) ذَاتَ يَوْمٍ إِذْ طَلَعَ عَلَيْنا رَجُلٌ شَدِيدُ بَياضِ الثِّيَابِ ، شَدِيدُ سَوَادِ الشَّعَرِ ، لاَ يُرَى عَلَيْهِ أَثَرُ السَّفَرِ ، وَلاَ يَعْرِفُهُ مِنَّا أَحَدٌ ، حَتَّى جَلَسَ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) ، فَأَسْنَدَ رُكْبَتَــيْهِ إِلَــى رُكْبَتَــيْهِ ، وَوَضَعَ كَــفَّــيْهِ عَلَى فَخِذَيْــهِ ، وَقَالَ : يَا مُحَمَّدُ أخْبِرْنِي عَنِ الإِسْلامِ .

فَقَالَ رَسُولُ الله (ﷺ) : الإِسْلاَمُ أنْ تَشْهَدَ أَنْ لا إلَهَ إلاَّ الله ، وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ الله ، وَتُقِيمَ الصَلاةَ ، وَتُؤْتِيَ الزَّكَاةَ ، وتَصُومَ رَمَضَانَ ، وَتَحُجَّ الْبَيْتَ إِنِ اِسْتَطَعْتَ إِلَيْهِ سَبِيلا .

قال : صَدَقْتَ .

فَعَجِبْنا لَــهُ ، يَسأَلُهُ ويُصَدِّقُه !

قال : فَأَخْبِرْنِي عَنِ الإِيــمَانِ .

قال : أنْ تُؤْمِنَ بِالله وَمَلاَئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلهِ وَاليَوْمِ الآخِرِ ، وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ .

قال : صَدَقْتَ .

قال : فَأَخْبِرْنِي عَنِ الإِحْسَانِ .

قال : أَنْ تَعْبُدَ اللهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاك .

قال : فَأَخْبِرْنِـــي عَنْ السَّاعة .

قال : مَا الـــمَسْؤُولُ عَنْهَا بِأَعْلَمَ مِنَ السَّائِلِ .

قال : فَأَخْبِرْنِـــي عَنْ أَمَارَاتِهَا .

قال : أَنْ تَلِدَ الأَمَةُ رَبَّتَهَا ، وَأَنْ تَرَى الْحُفَاةَ الْعُرَاةَ الْعَالَةَ رِعاءَ الشَّاءِ يَتَطَاوَلُونَ فِي الْبُنْيَانِ .

ثُمّ انْطَلَق ، فَلَبِثْنا مَلِيًّا .

ثُمَّ قال : يَا عُمَرُ أَتَدْرِي مَنِ السَّائِلُ؟

قلت : اللهُ وَرَسُولُهُ أعلَم .

قال : هَذَا جِبْرِيلُ أَتَاكُمْ يُعَلِّمُكُمْ أَمْرَ دِينِكُمْ))[١] .

واتە : لە (عومەر)ەوە ڕەزای خوای لێبێت فەرموویەتی :

لە کاتێکدا کە ئێمە دانیشتبووین لە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ناکاودا پیاوێکی جل و بەرگ زۆر سپی و موو زۆر ڕەش دەرکەوت بۆمان ، شوێنەواری سەفەر کردنی پێوە نە دەبینرا ، و کەسیش لە ئێمە نەیدەناسی ، تاوەکو لە لای

---

[١] صحيح مسلم رقم : (١) .

پێغەمبەردا (ﷺ) دانیشت ، جا هەردوو ئەژنۆی دایە پاڵ هەردوو ئەژنۆی پێغەمبەرەوە ، و هەردوو لەپی خستە سەر هەردوو ڕانییەوە ، ئەنجا وتی :

ئەی (مُحَمَّد) هەواڵم بدەرێ سەبارەت بە ئیسلام .

پێغەمبەری خوایش (ﷺ) فەرمووی : ئیسلام بریتییە لەوەی کە شایەتی بدەیت بەوەی کە هیچ پەرستراوێك نییە شایستەی پەرستن بێت جگە لە خوا ، وە بەڕاستی (مُحَمَّد ﷺ) پێغەمبەری خوایە ، و نوێژە فەرزەکان بە ڕێك وپێکی بکەیت ، و زەکات بدەیت ، و ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگریت، و حەجیماڵی خوای گەورە ئەنجام بدەیت ئەگەر توانات هەبوو .

وتی : ڕاستت کرد .

ئێمەش سەرمان سوڕما لەوەی کە پرسیاری لێدەکات و کەچی بەڕاستیشی دەخاتەوە !

وتی : هەواڵم بدەرێ سەبارەت بە ئیمان .

پێغەمبـەری خـوایش (ﷺ) فـەرمووی : ئیمـان بـریتـیـیـە لەوەی کە باوارِ بێنیت بە خوا و فریشـتەکانی و کتێبـەکانی و پێغەمبـەرەکانی و ڕۆژی دوایـی ، وە بـاوەڕ بێنیـت بـە قـەدر خێر و شەڕی .

وتـی : ڕاستت کرد .

وتـی : هەواڵم بدەرێ سەبارەت بە چاکەکاری .

پێغەمبەری خوایش (ﷺ) فەرمووی : چاکەکاری بریتییە لەوەی کە خـوا بپەرستیت وەکـو ئـەوەی کـە بیبینیـت ، وە ئەگەر تۆ خوا نەبینیت ئەوا ئەو تۆ دەبینێت .

وتـی : هـەواڵم بـدەرێ سـەبارەت بـە کـاتی هـاتنی ڕۆژی دوایی .

پێغەمبــەری خــوایش (ﷺ) فــەرمووی : پرسـیار لێکـراو زاناتر نىيە لە پرسیارکار .

وتـی : کەواتە هەواڵم بدەرێ سەبارەت بە نیشانەکانی .

پێغەمبەری خوایش (ﷺ) فەرمووی : کەنیزەك خـاوەن و سەروەرەکەی خۆیی لێدەبێت ، وە دەبینیت کەسـانێکی پـێ

پەتی (الْحُفَاة) و ڕەش و ڕووت (الْعُرَاة) و هەژار و نەدار (الْعَالَة) و شوانی مەڕ و ماڵات (رِعاءَ الشَّـاء) بینایەی بەرز دروست دەکەن .

ئەنجا پیاوەکە ڕۆیشت و ئێمەش ماوەیەك چاوەڕێمان کرد .

ئەنجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : ئەی عومەر ئایا دەزانیت ئەوەی کە پرسیاری کرد کێ بوو ؟

وتم : خوا و پێغەمبەرەکەی زاناترن .

فەرمووی : ئەمە (جِبْرِيل) بوو هات بۆ لاتان بۆ ئەوەی بواری ئاینەکەتانتان فێر بکات .

# الأصلُ الثالثُ: معرفةُ نبيكُمْ محمد (ﷺ)

## بنچینەی سێیەم : ناسینی پێغەمبەرەکەتان محمد (ﷺ)

وهو مُحَمَّدُ بنُ عَبدِ اللهِ بنِ عبدِ الـمطلبِ بنِ هاشمٍ ، وهاشمٌ مِنْ قُرَيشٍ ، وقُرَيشٌ مِنَ العَرَبِ ، والعَرَبُ مِنْ ذُرِّيَّةِ إسماعيلَ بنِ إبراهيمَ الـخَليلِ عَليْهِ وعلى نبيِّنا أفضلُ الصَّلاةِ والسَّلامِ .

پێغەمبەر (ﷺ) ناوی (مُحَمَّد)ی کوڕی (عَبْدُ الله)ی کوڕی (عُبْدُ الـمطلب)ی کوڕی (هاشم)ـە ، وە (هاشم)یش لە عەشیرەتی (قُرَیش)ـە ، وە (قُرَیش)یش لە نەتەوەی (عەرەب)ن ، وە (عەرەب)یش لە وەچە و نەوەی پێغەمبەر (إسماعیل)ی کوڕی پێغەمبەر (إبراهیم الـخَلیل)ن باشترین درووود و سەلامی خوا لە سەر ئەو و پێغەمبەری خۆشمان بێت .

ولَـهُ مِنَ العُمْرِ ثلاثٌ وسِتُّونَ سنةً ، منها أربعونَ قَبْلَ النُّبُوَّةِ ، وثلاثُ وعشرون نبيّاً رسولاً ، نُبِّئَ بِـ (اقرأ) وأُرْسِلَ بـ(الـمُدَّثر) ، وبلدُهُ مَكَّةَ ، وهاجَرَ إلى الـمَدِينة .

پێغەمبەر (ﷺ) تەمەنی شەست و سێ (٦٣) ساڵ بووە ، چل (٤٠) ساڵیان لە پێش پێغەمبەرایەتیەوە بووە ، و بیست

و سێ (٢٣)ساڵیشیان پێغەمبەر (هەواڵپێدراو و نێردراو) بووە ، هەواڵپێدراوە بە سەرەتای سورەتی (اقرأ) ، و نێردراویشە بە سەرەتای سورەتی (المُدَّثر) ، خەڵکی مەککە بووە ، و کۆچیشی کردووە بۆ مەدینە .

بعثَهُ اللّٰهُ بالنَّذارَةِ عنِ الشِّركِ ، ويَدعُو إلى التَّوحيدِ .

خوای گەورە ناردویەتی بۆ ئاگادار کردنەوەی خەڵکی لە هاوبەش دانان (شیرك) بۆ خوا ، وە بۆ بانگەواز کردن بۆ یەکخواپەرستی (تەوحید) .

والدليلُ قوله تعالى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ١ قُمۡ فَأَنذِرۡ ٢ وَرَبَّكَ فَكَبِّرۡ ٣ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرۡ ٤ وَٱلرُّجۡزَ فَٱهۡجُرۡ ٥ وَلَا تَمۡنُن تَسۡتَكۡثِرُ ٦ وَلِرَبِّكَ فَٱصۡبِرۡ ٧﴾ [المدثر] .

بەڵگەش لەسەر ئەمە خوای گەورە فەرموویەتی :

ئەی ئەو کەسەی کە خۆت داپۆشیوە (١) هەستە خەڵکی ئاگادار کەرەوە (٢) وە پەروەردگارت بە گەورە ڕاگرە (٣) وە کردەوەکانت پاك بکەرەوە (٤) وە پشت بکە لە بتەکان (٥) وە منەتیش نەکەیت وابزانیت زۆرت کردووە (٦) وە ئارامت

هــەبێت لــە جێبــەجێکردنی فەرمانــەکانی پــەروەردگارت و سەرپێچی نەکەیت و چاوەڕوانی پاداشتی خوا بکە ﴿٧﴾ .

ومعنَى (قُمۡ فَأَنذِرۡ) يُنْذِرُ عنِ الشِّركِ ويدعُو إلى التَّوحيدِ .

واتــای : (هەســتە خــەڵکی ئاگــادار کــەرەوە) ئاگاداریــان بکاتــەوە لــە هاوبەشــدانان بــۆ خــوا و بانگــەوازیان بکــات بــۆ یەکخواپەرستی .

(وَرَبَّكَ فَكَبِّرۡ) أي : عَظِّمْهُ بالتَّوحيدِ .

(وە پــەروەردگارت بــە گــەورەیی ڕاگــرە) واتــە : بــە گەورەیی ڕایگرە

(بە یەکخواپەرستی) : بەوەی کە بە تەنها ئەو بپەرستیت .

(وَثِيَابَكَ فَطَهِّرۡ) أي : طَهِّرْ أَعْمالَكَ عَنِ الشِّرْكِ .

(وە کردەوەکانت پاك ڕاگرە) واتــە : کردەوەکانــت پــاك ڕاگــرە لــە هاوبەشــدانان (شــەریك بڕیــاردان بــۆ خــوای تــاك و تەنها) .

(وَٱلرُّجْزَ فَٱهْجُرْ) الرُّجْزُ : الأصنامُ ، وهَجْرُها تَرْكُها وأهلَهـا ، والبراءَةُ مِنْها وأَهْلِها .

(وه پشت بكه له بتهكان) ، پشـت ليْكردنيـان وازهيْنانـه ليْيان و لهو خهڵكانهش كـه بــت پـهرسـتن ، وه دووره‌پـه‌ريْز بوون و دابرِانه ليْيان و لهو خهڵكانهش كه بـت پـهرستن .

أَخَذَ على هذا عشْرَ سِنِينَ يَدعُو إلى التَّوحيدِ ، وبَعْـدَ العَشْـرِ عُرِجَ بِهِ إلى السَّمَاءِ وفُرِضَتْ عليه الصَّلواتُ الـخَمْسُ ، وصلَّى في مَكَّةَ ثلاثَ سنِينَ ، وبعدَها أُمِرَ بالـهِجْرَةِ إلـى الـمَدينةِ .

بـهردهوام بـوو لهسـهر ئهمـه بـۆ مـاوهى ده (١٠) سـاڵ بانگهوازى دهكرد بۆ يهكخواپهرسـتى ، وه دواى ئـهو ده (١٠) ساڵه بـهرز كرايـهوه بـۆ ئاسمـان و پيْـنج نويْژهكـهى لهسـهر فهرزكرا ، وه له مهككهدا بـۆ مـاوهى سـێ (٣) سـاڵ نويْـژى كرد ، وه دواى ئهوه فهرمانى پيْـكرا به كـۆچ كـردن بـۆ شـارى مهدينه .

والـهجرةُ : الانتقالُ مِنْ بَلَدِ الشِّرْكِ إلى بَلَدِ الإسلامِ .

وە **کۆچ کردن** بریتییە لە : گواستنەوە و جێگۆڕین لە وڵاتی شیرکەوە بۆ وڵاتی ئیسلام .

**والهجرةُ فَرِيضَةٌ على هذه الأُمَّةِ مِنْ بَلَدِ الشِّركِ إلى بَلَدِ الإسلامِ ، وَهِيَ بَاقِيَةٌ إلى أنْ تَقومَ السَّاعةُ .**

وە کۆچ کردن فەرزە لەسەر ئەم ئوممەتە لە وڵاتی شیرکەوە بۆ وڵاتی ئیسلام ، وە فەرزێتی کۆچ کردن بەردەوامە تاوەکو ڕۆژی دوایی دێت .

**والدليلُ قوله تعالى :** ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ قَالُوا۟ فِيمَ كُنتُمْ ۖ قَالُوا۟ كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ قَالُوٓا۟ أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةً فَتُهَاجِرُوا۟ فِيهَا ۚ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَسَآءَتْ مَصِيرًا ﴿٩٧﴾ إِلَّا ٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَٰنِ لَا يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلَا يَهْتَدُونَ سَبِيلًا ﴿٩٨﴾ فَأُو۟لَٰٓئِكَ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَعْفُوَ عَنْهُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَفُوًّا غَفُورًا ﴿٩٩﴾ ﴾ [النساء] .

بەڵگەش لەسەر ئەمە خوای گەورە فەرموویەتی : بەڕاستی ئەوانەی کەوا فریشتەکان گیانیان دەکێشن لە کاتێکدا کە ستەمیان لە خۆیان کردووە بە تاوانی

نیشتەجێبوون لە وڵاتی بێباوەڕیدا پێیان دەڵێن ئێوە لە کوێ بوون و چیتان دەکرد ؟ ئەوانیش وتیان : ئێمە بێ دەسەڵات بووین و نەماندەتوانی دینداری ئاشکرا کەین و نەشماندەتوانی کۆچ بکەین ، فریشتەکانیش پێیان دەڵێن : ئایا زەوی خوا فراوان نەبوو کۆچی تێدا بکەن ، ئەوانە جێگایان دۆزەخە و خراپترین سەرئەنجامیان هەیە ﴿٩٧﴾ تەنها ئەوانەیان نەبێت کە بەڕاستی بێ دەسەڵات بوون لە پیاوان و ئافرەتان و منداڵەکان ئەوانە کە توانا و ڕێگەچارەیان نەبوو و شارەزای ڕێگای کۆچ کردنیش نەبوون ﴿٩٨﴾ ئا ئەوا خوا چاوپۆشیان لێدەکات و لێیان دەبورێت ، خوای گەورە لێبوردە و لێخۆشبووە .

وقوله تعالى : ﴿ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ أَرۡضِي وَٰسِعَةٞ فَإِيَّٰيَ فَٱعۡبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾ [العنكبوت] .

وە خوای گەورە فەرموویەتی : ئەی ئەو بەندانەم کە باوەڕتان هێناوە بەڕاستی زەوی من فراوانە تەنها من بپەرستن .

قالَ البَغَوِيُّ رحمهُ اللهُ : سَبَبُ نُزولِ هذه الآيةِ في المسلمين الذين بِمَكَّةَ لَمْ يُهاجِرُوا ناداهُم اللهُ باسمِ الإيمانِ .

ئیمامی (البَغَوِي) ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی :

هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو موسڵمانانەی کەوا لە مەککەدا مابوونەوە و کۆچیان نەکردبوو خوای گەورە بانگیانی کرد بە ناوی باوەڕەوە .

والدليلُ على الهجرةِ من السُّنَّةِ قولُهُ (ﷺ) : ((لاَ تَنْقَطِعُ الْهِجْرَةُ حَتَّى تَنْقَطِعَ التَّوبَةُ ، وَلاَ تَنْقَطِعُ التَّوبَةُ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا))[١] .

وە بەڵگەش لەسەر کۆچ کردن لە سوننەتدا فەرموودەکەی پێغەمبەرە (ﷺ) کە فەرموویەتی : کۆچ کردن نابڕێتەوە تاوەکو تەوبە کردن نەبڕێتەوە ، وە تەوبە کردنیش نابڕێتەوە تاوەکو خۆر لە ڕۆژئاواوە هەڵنەیەت .

فلمَّا استقرَّ بالمَدينةِ أُمِرَ بِبَقيَّةِ شَرائعِ الإسلامِ مثل الزَّكاةِ ، والصَّومِ ، والحَجِّ ، والأَذانِ ، والجِهادِ ، والأمرِ بالمعروفِ والنهيِ عنِ المُنْكَرِ وغيرِ ذلكَ مِنْ شَرائعِ الإسلامِ .

---

[١] صحيح سنن أبي داود رقم : (٢٤٧٩) .

ئەنجا کاتێك لە مەدینە جێگیر بوو فەرمانی پێکرا بەوەی کە مابووەوە لە ئەحکامەکانی شەریعەتی ئیسلام وەکو زەکات و ڕۆژوو و حەج و بانگ و تێکۆشان و فەرمان کردن بە چاکە و قەدەغە کردنی خراپە و جگە لەمانەش لە ئەحکامەکانی شەریعەتی ئیسلام .

**أخذَ على هذا عَشَرَ سنينَ ، وبعدَها تُوُفِّيَ صلواتُ اللهِ وسلامُهُ عليهِ ودينُهُ باقٍ ، وهذا دينُهُ ، لا خيرَ إلاَّ دَلَّ الأمَّةَ عليهِ ، ولا شَرَّ إلاَّ حَذَّرَهَا منْه .**

بەردەوام بوو لەسەر ئەمە بۆ ماوەی دە (١٠) ساڵ ، دوای ئەوە پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کرد ، بەڵام ئاینەکەی ماوەتەوە ، ئەمەش ئاینەکەیەتی ، هیچ خێر و چاکەیەك نیی‌یە ئیللا ڕێنمایی ئوممەتەکەیی بۆ کردووە و پێشانی داون، وە هیچ خراپەیەکیش نی‌یە ئیللا ئوممەتەکەیی لێ وریا و ئاگادار کردووەتەوە .

**والخيُر الذي دلَّهَا عليْه : التَّوحيدُ ، وجميعُ ما يُحِبُّهُ اللهُ ويرضاهُ .**

وە ئەو خێر و چاکەیەی کە ڕێنمایی ئوممەتەکەیی بۆ کردووە و پێشانی داون بریتی‌یە لە : یەکخواپەرستی و هەموو ئەو شتانەش کە خوای گەورە خۆشیانی دەوێت و پێیان ڕازی‌یە .

والشَّرُّ الذي حَذَّرَهَا منه : الشِّرْكُ وجميعُ ما يكرَهُهُ اللهُ ويأباهُ .

وە ئەو خراپەیەش کە ئوممەتەکەیی لێ وریا و ئاگادار کردووەتەوە بریتی‌یە لە : هاوبەشدانان بۆ خوای تاك و تەنها و هەموو ئەو شتانەش کە خوای گەورە خۆشیانی ناوێت و پێیان ڕازی نی‌یە و قەدەغەی کردوون .

بعَثَهُ اللهُ إلى النَّاسِ كافَّة ، وافترضَ طاعَتَهُ على جَميعِ الثَّقلينِ: الجِنِّ والإنسِ .

خوای گەورە پێغەمبەری (ﷺ) ناردووە بۆ هەموو خەڵکی، وە گوێڕایەڵی کردنی فەرز کردووە لە سەر هەموو جنۆکە و مرۆڤێك .

والدليلُ قولُهُ تعالى : ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ﴿١٥٨﴾﴾ [الأعراف] .

بەڵگەش لەسەر ئەمە خوای گەورە فەرموویەتی :

ئـــەی پێغەمبـــەری خـــوا بڵـــێ : ئـــەی خەڵکینـــە مـــن پێغەمبەری خوام بۆ هەر هەمووتان .

وأكْمَلَ اللهُ بِهِ الدِّينَ .

وە خوای گەورە ئاینی ئیسلامی پێ کامڵ کردووە .

والدليلُ قولـــه تعـــالى : ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا ۚ ﴿٣﴾﴾ [المائدة] .

بەڵگەش لەسەر ئەمە خوای گەورە فەرموویـەتی : ئـەوا ئەمڕۆ من ئاینەکەتانم بـۆ کـامڵ کـردن و نیعمـەتی خـۆمم بـۆ تەواو کردن و بە ئیسلامیش ڕازی بووم کە ئاینتان بێت .

والدليلُ على مَوْتِـــهِ (ﷺ) قولُـــهُ تعـــالى : ﴿إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ عِندَ رَبِّكُمْ تَخْتَصِمُونَ ﴿٣١﴾﴾ [الزمر] .

بەڵگـەش لەسـەر مردنـی پێغەمبـەر (ﷺ) خـوای گـەورە فەرموویەتی : ئەی پێغەمبەری خوا بەڕاسـتی تـۆ دەمریت و بەڕاستی ئەوانیش (بێباوەڕ و هاوبەشدانەرەکان) دەمرن ﴿٣٠﴾

ئــەنجا بەڕاســتی هــەمووتان لــە ڕۆژی قیامەتــدا لــە لای پــەروەردگارتان ڕووبــەڕووی یــەکتر دەبنــەوە بــۆ یــەکلایی کردنەوەی ئەوەی ئایا کامتان لەسەر حەق بوون.

والنَّاسُ إذَا ماتُوا يُبْعَثُونَ .

وە خــەڵکی ئەگــەر بمــرن ئــەوا لــە پــاش مــردن زینــدوو دەکرێنەوە .

والدليلُ قولُهُ تعالى : ﴿مِنۡهَا خَلَقۡنَٰكُمۡ وَفِيهَا نُعِيدُكُمۡ وَمِنۡهَا نُخۡرِجُكُمۡ تَارَةً أُخۡرَىٰ ﴿٥٥﴾﴾ [طه] .

بەڵگــەش لەســەر ئەمــە خــوای گــەورە فەرموویــەتی : ئێوەمان لە زەوی دروست کردووە و دەشتان گێڕینەوە بۆ ناوی و جارێکی تریش دەرتان دەهێنینە دەرەوە لـێی .

وقولُهُ تعالــــى : ﴿وَٱللَّهُ أَنۢبَتَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ نَبَاتٗا ﴿١٧﴾ ثُمَّ يُعِيدُكُمۡ فِيهَا وَيُخۡرِجُكُمۡ إِخۡرَاجٗا ﴿١٨﴾﴾ [نوح] .

وە خــوای گــەورە فەرموویــەتی : خــوای پــەروەردگار ئێـوەی مرۆڤـــی لە

زەوی ڕواندووە (دروستی کردوون وەك ڕوەك) ﴿١٧﴾ ئەنجا دەشتان گێڕینەوە بۆ ناوی و جارێکی تریش دەرتان دەهێنینە دەرەوە لێی .

وبعدَ البَعْثِ مُحاسبُونَ ومَجزيُّونَ بأعْمالِهِمْ .

وە لە دوای زیندووبوونەوە لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکرێت سەبارەت بە کردەوەکانیان و پاداشتیشی لەسەر وەردەگرنەوە .

والدليلُ قولُهُ تعالى : ﴿وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ لِيَجْزِيَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔواْ بِمَا عَمِلُواْ وَيَجْزِيَ ٱلَّذِينَ أَحْسَنُواْ بِٱلْحُسْنَى ﴿٣١﴾﴾ [النجم] .

بەڵگەش لەسەر ئەمە خوای گەورە فەرموویەتی :

ئەوەی کە لە ئاسمانەکان و ئەوەش کە لە زەویدا هەیە هەمووی موڵکی خوان و دروستی کردوون بۆ ئەوەی پاداشتی ئەوانە بداتەوە کە خراپەیان کردووە بە کردەوەکانیان و پاداشتی ئەوانەش کە چاکەیان کردووە بداتەوە بە بەهەشت .

ومَنْ كَذَّبَ بالبَعثِ كَفَرَ .

وە هەر کەسێك زیندووبوونەوە بە درۆ بخاتەوە و باوەڕی پێی نەبێت ئەوا کوفری کردووە و بێباوەڕ دەبێت .

والدليلُ قولُــهُ تعــالى : ﴿زَعَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَن لَّن يُبۡعَثُواْۚ قُلۡ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتُبۡعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلۡتُمۡۚ وَذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ٧﴾ [التغابن] .

بەڵگەش لەسەر ئەمە خوای گەورە فەرموویەتی :

بێباوەڕەکان بۆچوونیان وایە کەوا زیندوو ناکرێنەوە ، تۆش بڵێ : بەڵێ سوێند بە پەروەردگارم بەدڵنیایی زیندوو دەکرێنەوە ئەنجا هەواڵی کردەوەکانیشتان پێ دەدرێت ، وە ئەوەش لای خوا ئاسانە .

وأرسلَ اللهُ جميعَ الرُّسلِ مُبَشِّرِينَ ومُنْذِرِينَ .

وە خوای گەورە هەموو پێغەمبەرانی ناردووە مـوژدەرن ـ بە چاکە و پاداشتی چاکەکاران ـ و ورياکەرەوە و ئاگادارکەرەوەشن ـ لە خراپە و سەرئەنجامی خراپەکاران ـ .

والدليلُ قولُهُ تعالى : ﴿رُّسُلٗا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعۡدَ ٱلرُّسُلِۚ ١٦٥﴾ [النساء] .

بەڵگـەش لەسـەر ئەمـە خـوای گـەورە فەرموویـەتی : پێغەمبـەرانێك کـە مـوژدەدەر و ئاگادارکـەرەوەن بـۆ ئـەوەی خەڵکی بیانویان بـە دەستەوە نـەبێت لـە لای خـوا لـە پـاش ناردنی پێغەمبەران .

وأولُهُمْ نُوحٌ عليهِ السلامُ ، وآخِرُهُم مُحَمَّدٌ (ﷺ) وهو خـاتِمُ النَّبيينَ .

وە (نـوح) یەکـەمین پێغەمبـەرە (علیـهِ السـلام) ، و (مُحَمَّد)یش (ﷺ) دوایین پێغەمبەرە (ﷺ) و کۆتایی پێهێنەری هەموو هەواڵپێدراوانی (پێغەمبەرانی) خوایە .

والدليلُ على أنَّ أوَّلَهُم نوح قوله تعـالى : ﴿إِنَّآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ كَمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ نُوحٖ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعۡدِهِۦۚ ١٦٣﴾ [النساء] .

بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە (نوح) یەکـەمین پێغەمبـەرە* خوای گەورە فەرموویەتی : ئـەی پێغەمبـەری خـوا بەڕاستی ئێمە سرووش (وەحیی)مان ناردووە بۆ تـۆ هـەر وەکو چۆن

* بڕوانە کتێبی (**پوختەیەك لە بیروباوەڕی ئیسلامەتی**) پەراوێزی لاپەڕە : (٥٢ ـ ٥٣).

سرووش (وەحیی)مان ناردووە بۆ (نوح) و پێغەمبەرانی دوای ئەو .

وكُلُّ أمَّةٍ بَعَثَ اللهُ إليها رسولاً مِنْ نوحٍ إلى محمـدٍ ، يـأمُرُهُمْ بِعبادَةِ اللهِ وحدَهُ ، ويَنْهَاهُمْ عنْ عبادَةِ الطاغوتِ .

وە خـوای گـەورە پێغەمبـەری نـاردووە بـۆ هـەموو ئوممـەتێك لـە (نوح)ەوە تـاوەکو (مُحَمَّـد) ، فـەرمانی پێیـان کـردووە بـە پـەرستنی خـوای گـەورە بـە تـەنها ، وە ڕێگـری پەرستنی جگە لە خوای لێیان کردووە .

والدَّليلُ قولُـهُ تعـالى : ﴿ وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ ﴿٣٦﴾ ﴾ [النحل] .

بەڵگـەش لەسـەر ئەمـە خـوای گـەورە فەرموویـەتی : بـەدڵنیایی لـە هـەموو ئوممـەتێك (کۆمەڵـە مرۆڤـێك)دا پێغەمبەرێکمان ناردووە بۆ ئـەوەی پێیـان بڵـێ : بـە تـاك و تـەنها خـوای گـەورە بپەرسـتن و خۆتـان دوور بخەنـەوە لـە تاغوت (پـەرستنی جگە لە خوا) .

وافترضَ اللهُ على جميعِ العبادِ الكُفْرَ بالطَّــاغُوتِ والإيـــمانَ باللهِ .

وه خوای گەورە فەرزی كردووە لەسەر هەموو بەندەكان كـەوا بێبـاوەڕ بـن بـە تـاغوت (پەرستنی جگـە لـە خـوا) و باوەڕیان بە خوا هەبێت .

قال ابنُ القيِّمِ رحمهُ اللهُ تعالى : معنَى الطَّاغوت ما تَجاوزَ بِـــهِ العبدُ حَدَّهُ مِنْ مَعبودٍ ، أو مَتبوعٍ ، أو مُطاع .

(ابنُ القيِّم) ڕەحمەتی خوای گەورەی لێبێت فەرموویەتی: واتای تاغوت ئەوەیە : هەر شتێك بەندە لـە سنووری خۆی بیهێنێتە دەرەوە و زیادە ڕەووی تێدا بكات لـە پەرستراو و چاولێكراو و گوێڕاڵی بۆ كراو .

والطَّواغيتُ كثيرونَ ورؤوسُهُمْ خَمسةٌ : إبليسُ لعنَهُ اللهُ ، ومَنْ عُبِدَ وهو راضٍ ، ومَنْ دعا الناسَ إلـــى عبادَةِ نفسِهِ ، ومَنِ ادَّعـــى شيئًا مِنْ عِلمِ الغيْبِ ، ومَنْ حكمَ
بغيرِ مَا أنزلَ اللهُ .

وه ئەوانەی كە زیادە ڕەوییـان تێـدا كـراوە (تاغوتـەكان) زۆرن و سەرەكانیان پێنجن : شەیتان لەعنەتی خوای لێبێت،

وه هەر کەسێك بپەرسترێت جگە لە خوا و خۆشی بەوە ڕازی بێت ، وە هەر کەسێك بانگەوازی خەڵکی بکات بۆ پەرستنی خۆی ، وە هەر کەسێك بانگەشەی شتێك بکات لە زانستی غەیب ، وە هەر کەسێك حوکم بکات بە جگە لەوەی کە خوا دایبەزاندووە .

والدليلُ قولُهُ تعالى : ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَاۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٥٦﴾﴾ [البقرة] ، وهذا هو معنَى : لا إله إلا الله .

بەڵگەش لەسەر ئەمە خوای گەورە فەرموویەتی :

زۆرداری لە ئایندا نییە ، بەدڵنیایی ڕاستی ڕوون کراوەتەوە لە چەواشەیی ، جا هەر کەسێك بێباوەڕ ببێت بە تاغوت (پەرستنی جگە لە خوا) و باوەڕ بێنێت بە خوا ئەوا بەدڵنیاییەوە دەستی گرتووە بە گرێ توووند و تۆڵەکەوە

(واته : لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ ) كه پچڕانی بۆ نی‌یه ، وه خواش بیسه‌ر و زانایه ، وه ئه‌مه‌ش* بریتی‌یه له واتای (لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ ) .

وفي الحديثِ : ((رَأْسُ الأَمْرِ الإِسْلاَمُ وَعَمُودُهُ الصَّلاَةُ وَذِرْوَةُ سَنَامِهِ الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ))[1] ، واللهُ أعلمُ .

وه له فه‌رمووده‌دا هاتووه پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) فه‌رموویه‌تی : سه‌ری هه‌موو شتێك ئیسلامه ، وه بڕبڕه‌ی پشتی ئیسلامیش نوێژ کردنه ، وه چڵه پۆپه‌که‌شی تێکۆشانه له پێناوی خوادا ، خواش زاناتره .

---

* مه‌به‌ستی ئه‌وه‌یه : (يَكْفُرْ بِٱلطَّٰغُوتِ ) بێباوه‌ڕبوون به (تاغوت : په‌رستنی جگه له خوا) بریتی‌یه له واتای : (لَآ إِلَٰهَ ) ، وه (وَيُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ ) باوه‌ڕهێنان به خوا بریتی‌یه له واتای : (إِلَّا ٱللَّهُ ) .

[1] صحيح سنن الترمذي رقم : (٢٦١٦) .

# الأصول الثلاثة وأدلتها

تأليف شيخ الإسلام:

## محمد بن عبد الوهاب

رحمه الله

ترجمة:

محمد عبد الرحمن لطيف

مراجعة:

خليل أحمد

بشتيوان صابر عزيز

باللغة الكردية

وكالة المطبوعات والبحث العلمي
وزارة الشؤون الإسلامية والدعوة والإرشاد
المملكة العربية السعودية
١٤٣٩ هـ